زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# سێ كەس لەناو ئەشكەوتەكەدا







المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami


الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

نـــــــاوی کتێـــــــب: زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ):کوپەڵەی ئاڵتونەکە
نـــووسیـنـــــــی: شادی فقیە
وەرگێـــــــڕانــــــی: سەردار ڕەزا
پێداچوونەوەو هەڵەچنی: محەمەد مێرگەیی
نەخشەسازی نـــاوەوە: محمد علی احمد
ســـــاڵی چـــــاپ: ٢٠١٠ ز
شـــوێـنـی چـــــاپ: بەیروت ـ لوبنان
ژمـــــارەی ســپـــاردن: (١١٢٥)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
پێگەی ئەلیکترۆنی: www.nareenco.com
ئیمەیل: nareen@nareenco.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

المكتب الاسلامي

زنجیرەی

جوانترین چیرۆك

لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

# سێ کەس لەناو ئەشکەوتەکەدا




نووسینی

شادی فقیە

وەرگێڕانی

سەردار ڕەزا





الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

ناریـن

المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

پەردەکانی تەلارەکە لەگەڵ شنەی شەماڵە جوانەکەدا یاریان دەکرد. منداڵەکان خۆیان ئامادەدەکرد بۆ ئێوارە دانیشتنەکەیان.

باوك: ئیبراهیم، فاتیمە، ئێوە لەکوێن؟

فاتیمە: بەڵێ بابەی خۆشەویستم.

ئیبراهیم: سڵاوت لێبێت بابە گیان.

باوك: سڵاوو ڕەحمەتی خوا لەسەر ئێوەش بێت، وا کاتی خەوتنان نزیك بۆتەوە.

فاتیمە: بابە گیان ئەی تۆ بەڵێنت پێ نەداوین کە لەپێش خەوتندا چیرۆکێکمان لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بگێڕیتەوە.

باوك: بەڵێ بەڵێ، چیرۆکێکی جوانتان بۆ دەگێڕمەوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی داوەتە هاوەڵە بەڕێزەکانی، ئەویش چیرۆکی (سێ کەس لە ئەشکەوتەکەدا)یە.

لەزەمانی زوودا شوانێك و بازرگانێك و جوتیارێك هەبوون، بڕیاریاندا بڕۆن بۆ وڵاتێکی دوور.
کەلوپەلی سەفەرکردنیان ئامادەکرد و خۆراکیان پێچایەوە و بە بیاباندا کەوتنەڕێ.
بەڵام لەکاتی سەفەرەکەیاندا گێژەڵۆکەو بایەکی بەهێز هەڵی کرد.

## گەشتێك لە بیاباندا

شوانەکە: وا ڕەشەبا بەهێزی کردو شەویش داهات و ڕێگای سەفەرەکەشمان زۆری ماوە.
بازرگانەکە: بەڵێ براکەم، پێویستە خۆمان بگەیەنینە شوێنێك تا تیایدا پارێزراوبین لەو بایە بەهێزەو تا بەیانی تیایدا بمێنینەوە ، لەبەرئەوەی ڕۆیشتنی زۆرمان ماوەو ڕێگاکەشی دوورودرێژە.

خاوەنی کێڵگەکە: ئەها بڕوانن بۆ دوور، سەیرکەن چی دیارە...

بازرگانەکە: لەکوێ؟

خاوەنی کێڵگەکە: بۆ ئەو ئەشکەوتە لەو شاخەدا.

شوانەکە: سوپاس بۆ خودا، دەتوانین تاسبەینێ لەو ئەشکەوتەدا خۆمان بپارێزین.

بازرگانەکە: تۆ ڕاست دەکەیت.

شوانەکە: بەناوی خواوە دەچینە ئەشکەوتەکەوە.

بازرگانەکە: سوپاس بۆ خوا.

باوك: لەدوای ئەوەی کە سێ پیاوەکە خەویان لێ کەوت، ڕەشەبا و گێژەڵوکەکە توندتربوو، بەردێکی گەورەی لەسەر شاخەکە جولاندو هاتە خوارەوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی داپۆشی.

## چیرۆکی شوانەکە

بازرگانەکە: ئاه...خوایە گیان ئەو دەنگە چی بوو؟!

شوانەکە: ئەی پەروەردگارم خۆ دەرگای ئەشکەوتەکە داخرا.

خاوەنی کێڵگەکە: دەی با هەوڵبدەین بەردەکە لە قاپی ئەشکەوتەکە دوور بخەینەوە.

ئ ئ هـ ... ئ ئ هـ... ئاه

بازرگانەکە: بەڕاستی بەردێکی گەورەیە.

خاوەن کێڵگەکە: هەوڵدان بێ سوودە لەبەرئەوەی بەردەکە گەورەیە.

شوانەکە: ئەی چار چییە؟

بازرگانەکە: هیچ چارەیەکمان نییە ئەوە نەبێ کە داوا لە خوا بکەین لەم ئەشکەوتە ڕزگارمان بکات.

شوانەکە: با ئێمە بە چاکترینی کردەوەیەك کە لەبەر خوا کردوومانە لە خوا بپاڕێینەوە هەتا لەم ناڕەحەتیە ڕزگارمان دەکات.

خاوەن کێڵگەکە: چاکترین بیرکردنەوەیە، پشت بەخوا ببەستن.

شوانەکە: ئەی پەروەردگار، من باوك‌و دایکێکم هەبوو، کە زۆر بە پەرۆشەوە بووم بۆ خزمەتکردنیان، ئەوەبوو خۆم لە شیرەکەم نەدەخواردەوە هیچ کەسێکی تریش لە خانەوادەکەم لێیی نەدەخواردەوە، تاکو دەرخواردی باوکم و دایکمم دەدا، ڕۆژێکیان درەنگ هاتمەوە بۆ ماڵەوە، ئەوانیش لەپێش ئەوەی لە شیرەکە بخۆنەوە خەویان لێکەوت بوو، لەوە ترسام کە ئەگەر لە خەوەکەیان هەڵیانسێنم بێزاریان بکەم، ئیتر ئەوشەوە نە خۆم‌و نە منداڵەکان لە شیرەکەمان نەخواردەوە.

منداڵەکە: بابە... بابە...حەز لە شیردەکەم.

شوانەکە: ڕۆڵەکانم چاوەڕوان بن، تا باپیرەو داپیرەتان لە خەو هەڵدەستن‌و لێی دەخۆنەوە.

ئەوەبوو بەرەبەیان باوکم‌و دایکم خەبەریان بوویەوەو لە شیرەکەیان خواردەوە، لەدوای ئەوان من‌و هاوسەرەکەم‌و منداڵەکانیشم خواردمانەوە.

جا خوایە گیان ئەگەر ئەو کردەوەیم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردووە، ئەوا دەرووومان لێ بکەرەوەو لەم ناڕەحەتیە ڕزگارمانکە کە تێی کەوتووین.

**بازرگانەکە:** سوپاس بۆ خوا ئەها بەردەکە جوڵا و تۆزێك لە شوێنی خۆی خزا.

**خاوەن کێڵگەکە:** بەڵام تا ئێستا هەر توانای چوونە دەرەوەمان نییە، ئینجا تۆ بە کردەوەکانت لەخوا نزیك ببەرەوە.

# چیرۆکی بازرگانەکە

بازرگانەکە: منیش کچە مامێکم هەبوو، کە زۆر زۆرم خۆشدەویست تاوای لێ هات بووە خۆشەویستترین کەسێك بەلامەوە، زۆر جوان بوو، ئاواتەخوازبووم بەبێ مارەبڕین بۆ من بێت، بەڵام ڕەتی کردەوە.

ڕۆژێکیان پێویستی بەپارە هەبوو هات بۆلام.

ئافرەتەکە: سڵاوت لێبێت ... ئامۆزا.

بازرگانەکە: سڵاو لە تۆش بێت کچە مامەکەم، کە خۆشەویسترین کەسی لە دڵما.

ئافرەتەکە: ژیانم لەسەر گران بووە و پێویستم بە تۆزێ پارە هەیە.

بازرگانەکە: ڕۆشنایی چاوەکانمی، چەندت دەوێ بیبە.

ئافرەتەکە: نا پێویستی زۆرم نییە، لە سەد و بیست دینار زیاترم ناوێت.

بازرگانەکە: فەرموو ئەوە پارە.

ئافرەتەکە: ئامۆزا، خوا پاداشتی خێرت بداتەوە.

بازرگانەکە: بەڵام من داواکارییەکم هەیە!

ئافرەتەکە: داواکارییەکەت چییە؟؟

بازرگانەکە: دەمەوێت تۆزێك لێم نزیك ببیتەوە.

ئافرەتەکە: پەنا بە خوا، لە خوا بترسە، بە حەڵاڵی نەبێت دەستت بەرم ناکەوێت.

بازرگانەکە: داوای لێبوردن لەخوا دەکەم، خوایە گیان لێم خۆشبە، ئامۆزا لێم ببوورە، ئەوە شەیتان لە خشتەی بردم.

لێیی دوور کەوتمەوەو پارەکەم بۆ بەجێهێشت.
جا ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەو کارەی کردم لەبەر ڕەزامەندی تۆ بوو، ئەوا دەرووومان لێ بکەرەوەوەو لەو بەڵای ئەم بەردە ڕزگارمان بکە.

شوانەکە: سوپاس بۆ خوا ئەوا بەردەکە جوڵایەوەو خزاو ڕۆشنایی زیاتر دەرکەوت، بەڵام هێشتا هەر ناتوانین لێوەی بچینە دەرەوە.

بازرگانەکە: هەر تۆ ماوی تۆش قسەی خۆت بکە.

**خاوەن کێڵگەکە:** خوایە گیان! من چەند کەسێك لەلام بوون بە کرێ کاریان بۆ دەکردم، یەکێکیان کە کاری بۆ کردم کرێیەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت بە ڕێی خۆیەوە بەبێ ئەوەی وەری بگرێت، منیش دامام چی بکەم لە کرێیەکەی، پارەکەیم بۆ خستە کارو بەرهەمهێنانەوە، تا پارەکە پارەی زۆری لێوە پەیدابوو، لەدوای چەند ساڵێك.

**کرێگرتەکە:** ئەی بەندەی خوا ئەو کرێیەم بۆ بگێڕەوە کە لە پێش چەند ساڵێکەوە لە لای تۆ بە جێم هێشت.

**خاوەن کێڵگەکە:** ئەو هەموو مانگاو حوشترو مەڕانە لە کرێکەی تۆوە پەیدا بوون.

**کرێگرتەکە:** ئەی بەندەی خوا لە خوا بترسەو گاڵتەم پێ مەکە، سوێند بە خوا لە کرێکەی خۆم زیاترم ناوێت.

**خاوەن کێڵگەکە:** پەنا بە خوا، من گاڵتە بە تۆ ناکەم، ئەوانە هەمووی سامانی تۆن، بۆم بەرهەم هێناویت، سامانی تۆ لە لای من ئەمانەتەو مافی خۆتە بیبەرەوە.

لە خۆشیان هەمووی بردەوەو هیچی لێ بەجێ نەهێشت.

ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەو کارەم لەبەر گوێڕایەڵی تۆ کردووەو لەبەر ڕەزامەندی تۆ بووە، ئەوا لەم ئەشکەوتە ڕزگارمان بکە.

# وەڵامدانەوەی دوعا

**شوانەکە:** ئەها .. ئەوا بەردەکە نەما.

**بازرگانەکە:** سوپاس بۆ خوا، پەروەردگار وەڵامی دوعاکەی داینەوە.

**خاوەن کێڵگەکە:** ئەوە هۆی ئەوە بوو کە ئێمە لە خۆشیدا خوامان ناسی، خوا لە کاتی تەنگانەدا هات بە هاوارمانەوە، ئەی پەروەردگار سوپاس و ستایشمان بۆ تۆ.

**باوك:** ڕۆڵەکانم چیرۆکی سێ کەسەکەی ناو ئەشکەوتەکە بەم شێوەیە بوو. کەواتە دەبێ باش بزانن، کە خوای پەروەردگار بەندە دڵسۆزەکانی خۆی لەبیر ناچێتەوەو لە هەموو تەنگانەیەك ڕزگاریان دەکات.

**ئیبراهیم:** بابە گیان ، ئینشائەڵڵا خوا بیکات منیش صالح دەبم و بە هیچ شێوەیەك خوام لەبیرناچێتەوە.

**فاتیمە:** منیش بەهەمان شێوە بابە گیان.

**باوك:** ئافەرین ڕۆڵەکانم.

## قال رسول الله ـ ﷺ.

((انطلق ثلاثةُ نفرَ ممن كان قبلكم حتى آواهم المبيتُ في غار فدخلوه، فانحدَرتْ صخرةٌ من الجبلِ فسدَّت عليهم الغار، فقالوا: إنه لا ينجيكم من هذه الصخرةِ إلا أن تدعوا الله – تعالى – بصالحِ أعمالِكم. قال رجالٌ منهم: اللهم لي ابواني شيخان كبيران وكنت لا اغبق قبلهم اهلا ولا مالا، فنأى بي طلبُ الشجر يوماً، فلم أرِحْ عليهما حتى ناما، فحلبتُ لهما غبوقهما، فوجدتُهما نائمَين، فكرهت أن أوقظهما، وأن أغْبق قبلهما أهلاً أو مالاً، فلبثتُ والقدحُ على يديّ أنتظر استيقاظهما حتى برق الفجرُ، والصبيةُ يتضاغون عند قدميّ، فاستيقظا فشربا غبوقهما، اللهم إن كنتُ فعلتْ ذلك ابتغاءَ وجهِك ففرّجْ عنا مانحنُ فيه من هذه الصخرةِ، فانفرجَتْ شيئاً لايستطعونَ الخروج منه.

قال الآخر: اللهمَّ كانت لي ابنة عمّ كانت أحبَّ الناس إليّ، وكنتُ أحبُّها كأشدّ مايحبُّ الرجالُ النساء، فأردتُها على نفسها فامتنعتْ منّي حتى ألّمت بها سنةٌ من السنين، فجاءَتْني فأعطيتُها عشرينَ ومائة دينارٍ على أن تخليَ بيني وبين نفسها ففعلَتْ، فلما قعدت بين رجليها قالت: إتق الله ولاتفضَّ الخاتم إلاَّ بحقّه. فانصرفتُ عنها، وهي أحبُّ الناس إلي، وتركتُ الذهب الذي اعطيتها اللهم ان كنتُ فعلتُ ذلك ابتغاءَ وجهِك فافرجْ عنا مانحنُ فيه. فانفرجت الصخرةُ غيَر أنهم لا يستطيعون الخروج منها.

وقال الثالث: اللهمَّ إني استأجرتُ أجراء وأعطيتُهم أجرَهم غيرَ رجلٍ واحدٍ تركَ الذي له وذهبَ ، فثمرتُ أجرَه حتى كثُرتْ منه الأموالُ، فجاءني بعد حينٍ فقال: يا عبدالله، أدّ إلي أجري، فقلتُ كل ماترى هو من أجرِك: من الإبل، والبقر، والغنم، والرقيق. فقال: يا عبدالله، لاتستهزيء بي. فقلت: لا أستهزيُّ بِكَ، فأخذه كلَّه فاستاقه، فلم يترك منه شيئا، اللهم إن كنتَ فعلتُ ذلك ابتغاء وجهِك فافرج عنا مانحنُ فيه، فانفرجَت الصخرةُ فخرجوا يمشون)).

بوخارى (٢٢٧٢) و موسليم (٢٧٤٣) گێڕاويانەتەوە.